# تـەفسیری سورەتـی (الأنفـال)

## هـەڵێـنجـاو لـە تـەفسیـری ڕامـان

بۆ ڕاستکردنـەوەی ئـەو هـەڵـە نـاشـەرعییـانـەی کـە کۆمـەڵێك لـەمسوڵمـانـان تێـی کـەوتـون بـەهۆی ئـەوتـەفسیرە هـەڵـەیـەی کـە کۆمۆنیست وعـەلـەمـانییـەکـان کـردوویـانـە بۆ خـەڵـکـی و وە لاَمێکیش بۆ ئـەوبـێ ڕەوشتـانـەی کـە بـێ ڕێزی بـەم سورەتـەو سـەرجـەم قورئـانـی پیرۆز دەکـەن

ئـامـادەکـردنـی: بـاوکـی ئـەسمـاء

چـاپـی یـەکـەم2010

إن الْحَمْد لِلَّهِ نحمده و نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ومن سيئات أعمالنا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ )

(ال عمران **102**)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا)

( النساء **1**)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا)

(الأحزاب **70 – 71**)

**أما بعد**

فإن أصدق الحديث كتاب الله ،وخير الهدي هدي محمد(صلى الله عليه وسلم)و شر الأمورمحـــدثاتها وكل محدثة بدعة ،وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

پێشەکی:

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای گەورە و بێ هاوتا سە ڵاواتی خوا لەسەرپێغەمبەری ئاخیرزەمان محمد (صلی الله علیە وسلم) ماوەیەکە کەم تا زۆرێك هەست دەکەم کە کە سانێکی نەفس نزم و بێ ڕەوشت لە دوای ئەوەی کە فکرە بۆ گەنە کانییان ئیفلاسی هێناوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو ڕوخان دەچێت ولە بەرامبەر هەموو ئەمانەشدا کە ئوممەتی ئیسلام لەم سەردەمی بێ شوانیەتیە ی کە بێباوەڕان بە هەموو هێزێکییانەوە لەهەوڵی ئەوەدان ڕێی پێ بگرن و لەبەرچاوی خەڵکی دا ناشرینی بکەن کەچی دەبینین بە کوێرایی چاوی دووژمنانی ئیسلام لەگەڵ ئەو هەموو ڕێگرییە ی کە لە ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێت ڕۆژانە بە دەیان هەواڵی خۆش لە ڕۆژنامەو میدیاکانەوە دەبیستین کەوا بەردەوام لێشاوێکی زۆر لەخەڵکی لە دوای تێگەشتنییان لە بیرو باوەڕی گەندەڵ و بێ کەڵك دەگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئیسلامی ڕاستەقینە، هەربۆیە دەبینین بێبڕوایان ئەوەندەی کە دڵییان دە ئاوسێت و چاوییان کوێر دەبێت کە هەرچی هەوڵ و کردەوەیانە بە فیڕۆ دەچێت ، بۆیە بە پەلەو هەڵە داوان نازانن چی بکەن دەکەونە بێ ڕێزی کردن و تۆمەت دروست کردن و دەیان کاری کەی قێزەون بە رامبەر ئیسلام و مسوڵمانان ، کە چەندێکیش هەوڵ بدەن مانگە شەو بێ باکە لە حە پە حەپ چو نکە تە نییا قوڕگی خۆی دێشێنێ و هەرگیز بە فووی ئەوانیش نوری خوا ناکوژێتەوە ، ئەوەی کە هاندەرم بوو بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم تەفسیرە کە من لێرەدا تە نییا وەك ئە هلی نقڵ دەیگەیەنم ئەو بێ ڕێزییانەیە کە لە کە ناڵ و ڕاگەیاندنەکانی عەلمانییەکان و چەندین کەسایەتی نەفس نزمی وەك(فەرهاد پیربال) خوا باڵی بکات، وە (هەڵمەت گۆران) خوای گەورە ئەگەر شیاوی هیدایەتە هیدایەتی بدەیت وە ئەگەرنا لە دوونیادا بیسوتێنە پێش ئاخیرەت هەروەکو چۆن لە تاو ڕق و کینەو داخی بەرامبەر بە ئیسلام لە کاتی بە ناو ئەنفالدا سورەتی ئەنفالی سوتاند تاوەکو بتوانێت لەم ڕێگەیەوە سۆزی خەڵکانێك بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و لاڕێیان بکات وە ك ئەوەی ئەنفال خواو پێغەمبەری خوا کردبێتییان بەسەر میللەتی کووردداǃ من لێرەدا پرسیار ێك دەکەم لە عەلمانییەکان ئایا حزبی بە عس ئیسلامی بوو یان عەلمانی؟ خۆ ئەگەر بڵێین ئیسلامی بوو ئەوا تا سەر ئێسقانتان درۆتان کرد چونکە هەموو لایەنە

ئیسلامییەکان لە ڕووکەش دا کاتێك لە هەوڵی ئەوەدان بگەن بە دەسەڵات لەبەر ئەوەیە کە حوکم بە بەرنامەی ئیسلام بکەن هەمووشمان باش دەزانین ئەو هەموو خاڵ و فەقەرانەی ئێستاش لە مەحکەمەکان دا کارییان پێدەکرێت هەمووی هی کاتی صەدامن لەوانەیە گۆڕانکاری کرابێت لە هەندێکییان دا بەڵام ئەوەشتان لە یاد نەچێت کاتێك ئەو حاکمەی مەحکەمەی صەدامی کرد صەدام پێی ووت تۆ شەهادەت لە لای ئێمە وەرگرتوە! کەوابوو بۆ بە لاتانەوە عەیبەیە ئەگەر بڵێن حیزبی بەعس عەلمانی بووە؟ لە بەر ئەوەی پیلانی گڵاوتان بۆ خەڵکی کەشف دەبێت؟ دەتانەوێت ئەو ڕقە ژەهراویی یەی کە بەرامبەر بەرنامەی ئیسلام هەتانە لەوخاڵەوە سەرنجی خەڵکی بەگشتی و کەس و کاری بە ناو ئەنفال بۆ خۆتان ڕاکێشن؟ لە ڕێی سۆزو عەطفی گورگ ئاسا خەڵکی چەواشەو گومڕابکەن؟ نا بێگوومان ئەم کارەشتان بێ سوود دەرچوو چوونکە ئەوەندی تر ڕیسوابوون لە بەرچاوی میللەت دا قازانج سەری مایەکەشتانی خواردوو ئەم جارەیان بە تەواوی مایە پووچ دەبن إن شاألله وە هەموو میللەت پێکەوە نەفرەتتان لی دەکەن تە نانەت ئەو دایك و باوکانەش نە فرەتتان لیدەکەن کە تائێستا بە پیلانی ژەهراوییان نە زانیون هەر وەك هەڵمەت گۆران دەڵێت من ئەگەر دایك و باوکم پێم بزانن حاشام لێدەکەن چونکە مسوڵمانن! من دەڵێم نە ك حاشا بە ڵکو دەستیشییان بت گاتێ بەسەلامەتی دەربازت نابێت لەدەستییان ئەی بێ ئابڕوو ، کەوابوو براو خووشکی باوەڕدارم لێرە بەدواوە دەبێت من و تۆ ئەسپەکانمان زیاتر تاو بدەین و تا درەنگ نە بووە دە بێت هەوڵ بدەین پێکەوە ئەو بانگەوازە چڕتر بکەینەوە و بیگەیەنین پێت وانەبێت کە تۆ ئەو توانایەت نییە و دەبێت خوێندنی شەرعی تەواو بکەیت و خۆت پڕ بکەیت ئەوجا هەوڵ دەیت ئەمە تەنییا حیلەو فێڵی شەیطانە ئاگاداربە! دەیەوێت بانگەوازەکەی خوا پەك بخات کە ناشتوانێت وەرە بیگەیەنە وەك ئەهلی نقڵ ئەو هەموو پەڕتووك و بابەتە شەرعییانە هەن کە لە لایەن کۆمەڵێك زاناو مامۆستاو بانگخوازی ڕاستگۆوە بۆمان بە جێماون وەرە مەیدان وەك پیاو و ژنی صە حابە و صە حابییە پێکەوە بە زانستی خوا چاوی هەڵمەت گۆرانەکان ئەوەندەی تر کوێر بکەین تاوەکو بە ڕق و کینەوە لە دوونیاشدا سەربنێنەوەو دواڕۆژیشییان مایە پووچ و سەرشۆڕبن. لە کۆتاییدا ئەوە ماوە کە بڵێم کە ئەم تەفسیرە بەزمانی کووردی وەرگیراو لە بەرنامەی دەنگی قورئان و تەفسیری ڕامان ی

زانای کۆچکردوو مامۆستا احمدی کاکە محموود خوای گەورە پلەی بەرزبکات لای پیاوچاکانی خۆی و پاداشتی ئەوکەسانەش بداتەوە کە ئەوبەرنامە بەسوودەیان ئامادەکردووە.

ئەوا ئێمەین ئەسپەکانمان زیاد تاو دەدەین
گەرڕێگەشمان کە ندوو زیخ بێت قەت ناوەستێین
بەرەو کاروانی خواناسی هەنگاو دەنێین
ڕێگە سەختەو کاتیش دەڕوا بە بێ وەستان
ماندوونابین و ناوەستین لە دەعوەمان
وانزیکین و بەڕێوەین بۆ لای دۆستان
دەبینە چقڵی چاوی هەڵمەت گۆران

ئامادەکردنی: باوکی ئەسماء

11 جمادی الأول, 1431

25/5/2010

| ژمارەی ئایەتەکانی(75) | سورەتی(الأنفال) مەدینیەیی | جوزئی:( 9 – 10) |
| --- | --- | --- |

(بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴿1﴾

**ئەنفال چییە؟**هاوەڵان لەبابەت ئەو دەستکەوتەی جەنگی (بەدر)ەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ بۆ کێبێ و، چۆن دابەش دەکرێ ؟ پێیان بڵێ: حوکمی(ئەنفال) بە دەست خواو پەیامبەرە، واتە: شێوەی دابەشکردنەکەی تایبەتە بەوانەوەدەبێ ئێوەش لەخوا ترستان هەبێ و، سەرپێچی لە بڕیارەکانی نەکەن و نێوان خۆتان بسازێنن و، دەبێ گشتان یەکبن و جیاوازی و کێشەتان نەبێت و، یەکتر ئاشت بکەنەوە و گشت کاتێ لە فەرمانی خواو، لەقەسەی پەیامبەری ئەو، گوێرایەڵیی بکەن ، بەتاییەتی دەربارەی دەستکەوتەکەی بەدر. (عوبادە) دەڵێت: ئەم ئایەتە لەبارەی ئێمەی ئەهلی بەدرەوە هاتە خوارێ، چونکە ئێمە بووین لە شێوەی دابەشکردنی دەستکەوتەکەدا کێشەو ناکۆکیمان بوو، ئەوسا خوایش ئەنفالەکەی لێ سەندینەوەو خستیە بەر دەست پەیامبەری خۆی (صلی الله علیه وسلم)، پێشەوا ( ئەحمەد) ریوایەتی کردووە, کە بڕواتان هێناوە، دەبێ ملکەچبن.

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿2﴾

**موسڵمانە ڕاستەكان بناسە:** باوەڕدارانی ڕاستەقینەو دڵسۆز هەر ئەوانەن كە هەرناوی خوا هێنرا، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەكەوێتە لەرزەو، ترسی لێدەنیشێت هەر كە ئایەتەكانیشی دەخوێنرێنەوە بەسەریانداباوەڕیان زیادو بەهێز دەبێ. ئیمامی (بوخاریی) و، گەلێ لە زاناكانی تر ئەم جۆرە ئایەتانە دەكەنە بەڵگەی زیادبوونی ئیمان و باوەڕ ، هەر وەكو جەماوەری ئەم ئوممەتەیش هەر ڕایان وایە، تەنانەتی پێشەوا (شافعی) و، ئیمامی (ئەحمەد) و هەندێكی دی باسی ( ئیجماع )ی لەسەر دەكەن. هەر بەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن، واتە: پشت و پەنایان هەر ئەوە

الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴿3﴾

ئەوانەشن كە بەڕێك و پێكی نوێژ ئەكەن و لەو بژێوەیش بەشمانداون لەرێی خوادا دەبەخشن، بەناوی زەكاتەوە بێت، یان بەناوی ێەدەقەوە

أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴿4﴾

باوەڕدارانی راستەقینە هەر ئەوانەن، چونكە كردەوەیشیان خستۆتە پاڵی ئیمانەكەیان بەلای پەروەردگاریانەوە پلەو پایە یەكی زۆرو، لێبوردن و رۆزیی بەردەوام و چاك و پاكیشیان هەیە.

ڕێنمایەکانی ئایەتی (١-٤):

١- تەقواو خۆ پارێزی لەبەزاندنی بڕیارەکانی خوا.
٢- ڕێکخستنی نێوان موسڵمانان و، پاراستنی تەبایی و ئاشتیی نێوانیان.
٣- بە یەکخواپەرستیی و تاعەت، ئیمان زیاد ئەکا، بە سەرپێچی ونافەرمانی ئیمان کەم دەکا.
٤- باوەڕداران هەندێکیان باوەڕیان کامڵە ، هەندێکیشیان کەم و کورتوناتەواوە.
٥- نیشانەی ئیمان کامڵی ئەمەیە کە لەم ئایەتانەدا روونکراوەتەوە.

كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِن بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ﴿5﴾

پەیڕەویی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ، بکە بە پیشەی خۆت:
هەرچۆنێ دەستەیەك لەموسڵمانەکان ، دەرچوونی تۆیان لە ماڵەکەت ( لە مەدینە) پێناخۆش بوو، ئەگەرچی بەفەرمانی پەروەردگارت بووو کارێکی رەواو دروستیش بوو، هەر ئاواش دابەشکردنی دەستکەوت و (ئەنفال)ـەکەیان - بەو شێوەیە- پێ ناخۆش بوو، بۆ دواییش بەخێریان تەواو بوو

يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿6﴾

هێمان - پاش دەرکەوتنی هەق و ڕاستیی- ئەوان دەمەقاڵێ و موجادەلەت لەگەڵ دەکەن سەبارەت بەو بڕیارە ڕاستەیە " بڕیاری جەنگ لەگەڵ کافراندا"دەڵێن: خۆ ئێمە بۆ جەنگ

نەهاتووین، بەڵکو هەر بۆ کاروانەکە هاتووین، جا لەبەرئەوە دەبێ بگەڕێینەوە" واتە: ئەگەر چی پێشیان خۆش نەبوو تۆ خۆت خاوەنی (ئەنفال)ەکە بیت و بەکێی ئەدەیت بیدەی، بەڵام خێر لەوە دابوو وا دەمەقالێ و ململانێت لەگەڵ دەکەن دەڵێیت بۆ مردنیان لێدەخوڕن و بە ئاشکرا مردن دەبینن و لە پێش چاویانەوەیە، چونکە ئەمان هەم ژمارەو هەم چەکیان لە بێ باوەڕەکان کەم تر بوو

وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتِيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ﴿7﴾

ئەی لەبیرتانە ! خوا بەڵێنی یەکێ لەدوو تاقمەکەی پێدان- کاروانەکە، یان سوپاکە- ئەوە بوو کاروانێك بە بازرگانییەکی زۆرەوە لە وڵاتی شامەوە- بە سەرۆکایەتی ئەبوسوفیان- دەگەڕایەوە ، پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەوەحیی و بەسروش ئاگادار کرابوو کە: یەکێ لەو دوودەستەیە- سوپاکە، یان قافڵەکە - دەسکەوتی ئێوە دەبێ، ئەوسا پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) مەشورەتی بەهاوەڵانی کرد، چی بکەن باشە؟ ئەوانیش لەبەرئەوە خۆیانیان ئامادە نەکرد بوو بۆ جەنگ، حەزیان لە قافڵەکە دەکرد. ئینجا کە لەودەمەدا کەهەراوکێشەیان لەناوپەیدا بوو، پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) تووڕەو دڵگران بوو لێیان، پاشان هاوەڵان ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ جەنگەکەو، تەنانەت بیشیانخاتە دەریاوە هەرئامادەن.. پاشان ئەویش موژدەی سەرکەوتنی پێدان (سیرەی ئیبن هیشام). حەزتان دەکرد ئەوقەی دەستە بێ چەکەکە بن، واتە: کاروانەکە، نەك لەشکرو سوپاکە خۆ خواش دەیەوێ بەڵێنەکەی خۆی بچەسپێنێ، دەیەوێ دینی هەق وراست (دینی

ئیسلام) زاڵ بکا و ڕەگ و ڕیشەی بێ باوەڕانیش ببڕێ

لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴿8﴾

ئەوە دەکا هەتا هەق و ڕاستیی سەقامگیر بکاو، ناڕەواو ناهەقیش، هەڵوەشێنێ با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت.

إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴿9﴾

هانا دەبەنە بەر خوا، ئەویش دێت بە هانایانەوە: وەبیر بێنن ئەودەمە کەناڕەحەت ودڵ نیگەران بوون و، هاناتان بۆپەروەردگارتان بردو پێغەمبەریش - وەك موسلیم هێناویەتی- ڕوویکردە ڕووگەو فەرمووی: خوایا! بەڵێنەکەی خۆتم بۆ جێبەجی بکە، خوایا! ئەگەر ئەم دەستەیە لەناوبچێت، ئیتر تۆ هەرگیز ناپەرستریێت، جا لەودەمەدا ئەم ئایەتە هاتوو فەرمووی: ئەوا پەروەردگارتان وەڵامی دانەوەکە: دڵنیابن بە شوێن یەکدا هەزار فریشتە بۆ پشتیوانیتان دەنێرم

وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴿10﴾

وە خوا ئەوەی هەر بۆ ئەوەکرد کە ببێتە مژدەی سەرکەوتننتان ودڵیشتان ئۆقرە بگرێ پێی و ئەوەش بزانن کە سەرکەوتن و یارمەتیش تەنها لای خوایە بە ڕاستیی خوا زۆر بەتواناو بەدەسەڵاتە، زۆریش کارجوان و لەکارزانە، ئەوەتە جیهاد فەرزدەکات هەتا نەیارو دوژمنەکانتان سەرکوت ببن.

إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴿11﴾

خوا له بەدردا بۆ ئۆقرەی دڵ هاوەڵانی خەواند: ئەوەشتان له بیر بێت - که بەڕۆژێ پێش جەنگەکه - بەخەوه نووچکه لەوکاتی نارەحەتیی و ترسەدا هێمنیی و ئاسوودەیی دایگرتن. (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ئەڵێت: لەو رۆژەدا هەموو خەومان لێکەوت، پەیامبەری خوا نەبێت (صلى الله عليه وسلم) ئەو لەبن دەرختێکدا هەر نوێژی ئەکردو، هه تا بەیانی له خزمەت پەروەردگارییدا پاڕایەوەو داوای یارمەتی لێکرد بارانیشی له ئاسمانەوه بۆتان نارد تا لەچڵك وچەپەڵی رێگه پاك و خاوێنتان بکاتەوه و بەد گومانیی وهەموو خەیاڵات و نیازێکی نەگونجاوی شەیتانیشتان لێ وه دوورخات و دڵنیاتانکات لەسەر یارمەتی خۆی وله گورەپانی جیهاددا پێتان مەحکەم و سەقامگیر کا. بەڵێ.. موسڵمانەکان پێش ئەوه بگەنه (بەدر) چڵك و چەپەڵی ڕێگەو، تینوویەتیی و، هەر حاڵەتێکی تری ناهەمواریان تووشببوو، جا خوای گەوره - وەك کەرامەت و ڕێزلێنان بۆیان- ئەو بارانەی بۆ باراندن و، ئەوانیش خۆیانیان پێخاوێن کردەوه.

إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴿12﴾

وەبیرتان بێت که پەروەردگارت نیگای بۆ فریشتەکان کرد: که بچن هاوکارییان بکەن، به ڕاستی خۆیشم لەگەڵتانم و غیرەت وەبەر بڕوادارەکان بنێن و، موژدەی سەرکەوتنیان بدەنێ و، دڵ ئەستووریان بکەن بۆخۆیشم زووترس و بیم ئەخەمه دڵی کافرو بێ باوەڕەکانەوه، هەتا هەڵبێن و جەنگییان پێنەکرێت دەسا ئێوەش- ئەی فریشتەکان- به توندی لەملیاندەن و هەموو پەنجەو

سەر پەنجەکانیان بپەڕێنن، هەتا لە کار دەکەون و، بە ئاسانی دیل ئەکرێن، وەیان ئەکوژرێن، واتە: سەروو دەستیان بپەڕێنن، هەتاجەنگییان پێنەکرێت

ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِقِ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴿13﴾

ئەوەش چونکە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن هەر کەسیش لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئەودا دژایەتی و ململانێ بکا بە ڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بەهێزە، سەختگیرە

ذَلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابَ النَّارِ﴿14﴾

دەسا لەدنیادا ئەوسزایە بچێژن بێگومانیش بن لە دوا رۆژدا سزای ئاگر بۆکافرەکان ئامادەیە.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفاً فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ﴿15﴾

**لەبەرزۆری دوژمن هەڵمەیەن:** ئەی گەلی خاون باوەڕ! هەر کە لەمەیدانی جەنگدا تووشی بێ باوەڕان بوون و بە زۆری هێرشیان بۆهێنان و کەم کەم لێتان نزیك دەبوونەوەنابێ پشتیان تێ بکەن و، هەڵبێن و ڕابکەن، بەڵکو دەبێ بەرامبەریان خۆ ڕاگربن

وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِّنَ اللّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴿16﴾

هەرکەسێك لە رۆژی ڕوو بەڕوو بوونەوەدا پشتیان تێبکات و خۆی بدزێتەوەو شوێنی خۆی چۆڵبکات مەگەر بۆ شەڕکردن لە شوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر، بە مەبەستی ئەوە جارێکی تر خۆی ساز بداتەوە بۆ هێرش ، وەیان بۆ ئەوەبێت فێڵ لەبێ بڕواکان

بكات ، ئەوسا خێرا بگەڕێتەوە سەریان بۆ جەنگ، دیارە لەم حاڵەتانەدا قەیدی نیە یان جێ گۆرکێ بکاو خۆی بگەیەنێتە تاقمێکی تری جەنگاوەرەکان ، بۆ ئەوە هەمووپێکەوە باشتر جەنگ بکەن، وەك دەڵێ: ( الحرب خدعة ).ئەوە بەدەر لەو حاڵەتانە، خەشم وقینێکی زۆری خوای دەکەوێتە سەر وجێ و ڕێیشی دۆزەخ دەبێ ئای دۆزەخیش چارەنووسێکی خراپە.

فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللّهَ رَمَى وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلاء حَسَناً إِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴿17﴾

**خوا خۆی خوانەناسانی کوشت لە بەدردا:** لەپاش ڕووداوەکەی (بەدر) خەریکبوو هاوەڵان جوامێریی و قارەمانیەتی خۆیانیان باس دەکرد، ئەوجا خوا فەرمووی: لەڕاستیدا ئێوە بێ باوەڕەکانتان نەکوشت لە بەدرا، چونکە شتی وا لە توانای ئێوەدا نەبوو، بەڵکو خوا بۆ خۆی هاوکاریکردن و کوشتنیی و، لەناوی بردن و، ئێوەشی سەرخست ئەودەمە کە تیرەکانت هاویشت ئەی پێغەمبەر ! (صلى الله عليه وسلم)خوا نەناسانتان تێشکان، لەواقیعدا هاوێژەرەکە تۆ نەبووی، چونکە تێشکانی ئەوانە لەتوانای تۆدا نەبوو ئەگەر خوات لەگەڵ نەبووبا، کەوابوو خوای باڵادەست بوو تیرەکانی هاویشت و بەوشێوە ترسی خستە دڵیانەوە، بەتایبەتی ئەو دەمە کەگڵ و زیخەکەت بۆ هەڵدان، چونکە ئەوەندە خۆڵ و زیخ ، کەی شایەنی ئەوەیە سوپایەکی گەورەی ئاوا سەرگەردان وتەفروتوونا بکات. (ئیبن عەبباس) دەڵێت: پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) لامستێك خۆڵی هەڵگرت وبەرەو روخساری موشریکەکان هەڵییدا فەرمووی: (( شاهت الوجوه )) واتە: خوایا! ئەم دەم و چاوانە گشت کوێرو

زەڕەتاڵ بکەیت! ئینجا هەریەکە لەوانە پارچە زیخ و خۆڵێکی بەرکەوت و لە ترسانا پشتیان هەڵکردو تێشکان ئەوکارە بۆ ئەوەشبوو کەخوای‌کارزان بڕوادارەکان چاك تاقیبکاتەوە، واتە بەهرەو نیعمەتێکی تری خۆی بەموسڵمانان بناسێنێ، ئەوە بوو ئەو هەموو دەستکەوتە جەنگییەی پێدان و، بێ باوەڕکانیشی تێشکان بێگومان خوا زۆر بیسەرو زنەوایە، بۆ خۆی نزاکەی پەیامبەری (صلی الله علیه وسلم) بیست و وەڵامیشی دایەوە، زانایشە بەدڵسۆزیی و ئیخلاسیان

ذَلِكُمْ وَأَنَّ اللّهَ مُوهِنُ كَيْدِ الْكَافِرِينَ﴿18﴾

ئەوکارانە بۆئەوەیە بزانن کە: بێگومانە خوای گەورە فرت و فێڵی خوانەناس و کافران ریسواو بێ ئاکام دەکات (زوهری) ئەڵێت: ڕۆژی بەدر(ئەبوجەهل) وتی: خوایا! هەرکامێکمان ئێمەو تاقمی موحەممەد کاممان خراپەو مافی خزمایەتیی پێشێل کردووە، دەمەوێ ئەمڕۆ لەناوی ببەیت. خوای گەورەش رووی قسەی دەکاتە بێ باوەڕەکان و، بە لاقرتییەوە پێیان دەفەرمووێت:

إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَاءكُمُ الْفَتْحُ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴿19﴾

ئەگەر سەرکەوتنتان دەوێت بەڵێ وا یارمەتی خواتان بۆ هات، بەڵام بەشی ئێوەی تێدانەبوو، چونکە ئێوە گوتتان: ( اللهم إن كان هذا هو الحق فأمطر علينا حجارة من السماء..) وا بۆتان هات ! جا ئەگەر لەجەنگ و دژایەتی پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) واز بێنن بۆدنیاو قیامەتتان قازانجتانە ئەگەر

بشگەڕێنەوە سەر جەنگ و، ئاژاوە نانەوە بۆ موسڵمانان ، وائێمەیش تێهەڵدەچینەوەو، وەك ڕۆژی بەدرتان لێ ئەکەینەوە دەستەو کۆمەڵەکەشتان چەندە زۆربێت، لەهیچ سزایەك بێ نیازتان ناکا، وەکو ڕۆژی بەدر خۆتان دیتان چۆن دەستەو بەستەکەتان تەفرو توونا بوو و هیچ کەڵکی نەبوو بۆتان بێگومان خوا لەگەڵ باوەڕداراندایەو، یارمەتییان ئەدا.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ﴿**20**﴾

**گوێڕاڵی خواو پێغەمبەر بن (صلی اللە علیە وسلم)** :ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گوێ بیستی خواو پەیامبەرەکەی بن وپشت لە فەرمانەکانی مەکەن کە: دەشبیسن چیتان بۆباس دەکات

وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لاَ يَسْمَعُونَ﴿**21**﴾

وەك ئەو موشریك و بێ باوەڕانە مەبن کە: گوتیان چوو بەگوێمانا! کەچی نەچوو بەگوێیانداو کەڵکیان لێ وەرنەگرت !. کۆمەڵێك لەهۆزی (بەنی عبدالدار) گوتیان: ئێمە سەبارەت بەو کتێبە موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم) هێناویەتی کەڕولاڵین و نابیسین، وە لەگەڵ (ئەبوجەهل)یشدا چوونە بەرەکانی جەنگ، ئەوجا خوا فەرمووی:

إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴿**22**﴾

بێگومان بێفەڕ ترینی ڕەوکەرو جوڵندە لای خوا ئەوخەڵکە کەڕو لاڵەیە تێناگات، واتە: بیر لەئایەت و بوونەوەر ناکاتەوەو خۆی گێل دەکا، بێشك ئەوانە لەهەموو گیانلەبەران پەستترن

وَلَوْ عَلِمَ اللّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴿23﴾

خۆ ئەگەر خوا زانیبای خێرێك بەناو چاویانەوەیە كارێكی دەكرد كە: وشەی هەق و ئامۆژگاریەكانی قورئان ببیسن، بەڵام بۆ خۆی دەزانێ كە: خۆماندوكردن لەگەڵیان بێ كەڵكە، وەكو دەفەرموێ: گریمان پێیشیان ببیسێ ڕوویان وەڕدەگێڕاو دەڕۆیشتن و باوەڕیان نەدەهێنا ، چونكە لە (ئەزەل)دا خوا دەزانێ هەرگیز باوەڕ ناهێنن ! كەوابوو تۆش خەریك مەبە لەگەڵیان.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴿24﴾

**بە دەنگ خواو پێغەمبەرەوە بچن:** ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! هەركە خواو پێغەمبەر بانگییان كردن بۆ ئەنجامدانی ئەوكارەی ئێوە دەژێنێتەوە ، ( واتە: گوێرایەڵی لەقورئان، جیهاد، رەوشتی پاك و بەرز... هتد) خێرا وەڵامیان بدەنەوەو فەرمانەكەیان جێبەجێ بكەن چاكیش بزانن كە بێگومان خوا دەتوانێ لەنێوان مرۆڤ ودڵییدا لەمپەردانێ و، نەهێڵێ تووشی هیچ خێرو چاكەیەك ببێت ، بۆیە دەبێ مرۆڤ هەمیشە لەخوا بترسێ و خۆی بداتە دەستی ئەو، هەر لەبەر ئەوەش بوو پەیامبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بەردەوام دەیفەرموو: (( **یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك..**)) خوایا! كەئاڵوگۆڕی گشت دڵەكان بەدەستی خۆتە، دەسا دڵم لەسەر دینی خۆت تۆكمە بكە ئەمەش براوەتەوە كە هەمووتان لای ئەو كۆ دەكرێنەوەو پاداشت و تۆڵەش وەردەگرنەوە.

وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴿25﴾

**له بەڵاو فیتنەی گشتگیر خۆ بپارێزن:** لەو فیتنەو بەڵایەش خۆپارێزن و بترسن ، کە کاتێ دێت، تەنها ئەوقەی ئەوانەتان نابێت ناهەقییان کردووەو دەستیان تێیدایە، بەڵکو یەخەی هەموان - گوناحبارو، بێ گوناح، چاك و خراپ - دەگرێتەوە، یان وەك دەڵێن: ( تەڕو وشك) پێکەوە دەسووتێ، بۆیە ( بوخاری) لە فەرموودەیەکدا هێناویەتی: کەخەڵکی ستەمکاریان دیی و، دەستیان نەگرت لەخراپەکەی، نزیکە خوای بە توانا جەزرەبەی هەموان بدات. بشزانن کە بێگومان تۆڵەی خوا توندو سەختە (سەدی) دەڵێ: ئەم ئایەتە لەکاتی خۆیدا بەتایبەتی بۆ ئاموژگاری (بەدر)یەکان هات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەدمەخابن لەرووداوەکەی (جەمەل)دا تووشی ئەوهەموو بەڵاو فیتنەیە بوون و لەناوخۆیاندا وەجەنگ هاتن !

وَاذْكُرُواْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴿26﴾

**ئەوسا چەن کەم و بێ دەسەڵات بوون؟!:** ئەوکاتە وەبیر بێننەوە کە ئێوە ئەی موسڵمانان ! لە مەککەدا کەم وکزبوون و لاوازو دەسە پاچەش بوون و دەترسان خەڵك بتانرفێنن و بتانکوژن لەوکاتەدا خوای میهرەبان پەنایدان و، شاری (مەدینە)ی کردە پەناگاتان و لە رۆژەکەی (بەدر)دا یارمەتیدان و پشتگیریی لێکردن و سەری خستن و ڕۆزیی پاك وچاکی پێبەخشین، کاروانەکەی کردە دەستکەوتتان گشت ئەمانەی بۆکردن بەشکو شوکرانە بژێرن.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴿27﴾

**له دینی خوا دەغەڵی مەکەن:** ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گزیی و خیانەت لەخواو لە پێغەمبەرو لە سپاردەکانتان مەکەن، واتە: نەیارو دوژمنی ئەوان مەکەنە یارو دۆستی خۆتان و، نهێنیەکانیان لابدرکێنن بۆ خۆیشتان چاك دەزانن کە گوناهو تاوانی خەیانەتکردن چەندە گەورەیەو، دەشگەڕێتەوە سەر ئەستۆی ئێوە. ئەم ئایەتە(وەك شێخی سیووتی) دەڵێ سەبارەت بە (ئەبوو لبابە)هاتە خوارێ، ئەو دەمە کەپەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) ناردی بۆ لای (بەنی قورەیزە) لەسەر داوای خۆیان سوڵح و سازشیان لەگەڵکا، جائەوانیش مەشۆرەتیان پێکردو گوتیان: بە بڕیاری (سەعد) ڕازین، کەچی ئامازەی بە قوڕگی کرد! واتە سازشیان لەگەڵ کەن تیا ئەچن!

وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴿28﴾

بشزانن کەبێگومان هەموو ماڵ و سامان و مناڵتان هۆی تاقییکردنەوەن بۆتان، بۆ ئەوەیە دەرکەوێ ئاخۆ ئێوە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەکەن؟ بڵێیت لەبەر ئەوان بەرژەوەندی ئیسلام وەلا نێن؟ئاشکرایشە پاداشی زۆرو زەبەنەو فراوان هەرلای خوایە. (ئەبوو لوبابە) لەنێو (بەنی قورەیزە)دا سامان و منداڵەکەی جێمابوو، لەبەر ئەوەبوو ئەو نەرمیەی لەگەڵ نواندن و ئەو (تەصریح)ـەیدا !

يِا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إَن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴿29﴾

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر لە خوا بترسن و

پارێزگاری بڕیارەکانی بکەن نوورێکتان دەداتێ بتوانن چاك و خراپی پێ لێك جیاکەنەوەو رێتان بۆ روونکاتەوەولە گوناهەکانی پێشووشتان ببوورێ و تاوانەکانیشتان ببەخشێ و خواش بۆخۆی خاوەنی بەهرەی زۆر گەورەو مەزنە.

وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴿30﴾

**لەبیرت بێ چ پیلانێکیان بۆ دارشتیت!**(ئیبن عەبباس) دەڵێت: ئەنجوومەنی قورەیش لە(دار الندوە) کۆبوونەوە، بۆ ئەوە دەربارەی پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخشەو پلانێکی ورد دابرێژن ! جاپاش وتوو وێژێکی زۆرو، شەڕە قسەیەکی نێوانیان، بڕیاریاندا بیکوژن..! (جبریل)یش بە فەرمانی خوا خێرا هەواڵەکەی دابەزاند، ئیتر پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم)، خۆی بۆ کۆچکردن ئامادەکرد، ئینجا پاش ئەوە کەگەیشتە (مەدینە) بەو جۆرە

کە ژیاننامە دەیگێڕێتەوە خواپیلانەکەی قورەیشی بۆگێڕایەوەو فەرمووی: ئەوکاتە وەبیر بێنە کەبێ باوەڕەکان دەیانویست فێڵت لێ بکەن کە: یا بتگرن و بەندت بکەن یان بتکوژن یان- هەر هیچ نەبێ - لە مەککە دەرت پەڕێنن بەڵێ.. فڕت و فێڵی خۆیان دەکەن ، دیارە خوایش پلانی خۆی دادەڕێژێ بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەیان دڵنیاشبن خوا لەهەموو پلاندانەرێك باشترە بۆ پووچەڵکردنەوەی فڕت و فێڵی پیلانگێڕان. سەیری (ئیبن هیشام) و ( أسباب النزول )ی سیووتی بکە.

وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُواْ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاء لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأوَّلِينَ﴿31﴾

وادەزانن دەتوانن وەك قورئان بلێین! هەرکە ئایەتەکانمان بۆ قورەیش بخوێنرێنەوە ئەوەندە یاخیی وسەرکەشن ئەڵێن: گوێمان لێبوو و بیستمان خۆ ئەر مەیلمان بێت هەر وەکو ئەمە دەڵێین ئەمە (موحەممەد) دەیلێت هەر قسەو ئەفسانەی پێشینانە (نەزری کوڕی حاریس) دەچێتە (حیرە)و هەندێ چیرۆك و داستانی (کیسرا) و (قەیسەر) و(کلیلە) و(دمنە) دەهێنێ، جا کە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) قورئانی بۆ ئەخوێندەوە دەڵێت: ( لو نشاء لقلنا مثل هذا..)!

وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴿32﴾

وەبیر بێنە ئەودەمە کە قورەیش وتیان: خوایا! ئەگەر ڕاستە ئەم قورئانە هی تۆیە لە ئاسمانەوە بەردە بارانمان بکە وەکو قارت لەگەلانی ترگرت وە یان سزایەکی ئێش پێگەیەنەرمان بۆ بێنە، دیارە ئەمە گەمەو لاقرتیی دەکات و، ئەوپەڕی نیشانەی نەفامیی و سەرسەختییانە، ئەگینا دەبوو لەباتی ئەوە داوای بەردەباران بکەن ، لەخوا بپاڕێنەوە ڕێنماییان بکات ، چونکە وەك (ئیبن کەسیر) دەڵێت: دەبوو بیانوتایە ( اللهم إن کان هذا هو الحق من عندك فاهدنا له ووفقنا ..) نەك داوای بەردە بارانی خۆیان بکەن!! بەڵێ..ئەودەمە کە ئەبوو جەهل وتی:(اللهم إن کان هذا هو الحق..)ئەم ئایەتە هات و فەرمووی:

وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴿33﴾

هەتا تۆ لە ناویاندابیت ئەی پێغەمبەر! ناکرێ خوا سزایان بدا، ئەگەرچی بۆخۆشیان داوای بکەن ، چونکە تۆ رەحمەت و میهرەبانیی و بەزەییت بۆ هەموان براوەتەوە کە: هەرکەسێك، یان هەر گەلێك - دوای کوفرو هەرتاوانێك - داوای لێبوردن بکات ، ناکرێ خوای دلۆڤان قاری لێ بگرێت، ئەگەرچی خراپیشبن.

وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴿34﴾

**دوای کاری خراپ، خوا چۆن جەزرەبەیان نەدا؟** جا بۆ خوا سزای ئەوانەیان نەداکە رێگەی مزگەوتی (حەرام) لە موسڵمانان دەگرن، بەتایبەتی ساڵی رووداوەکەی حودەیبیەخۆ ئەوانە خاوەنی مزگەوتی (حەرام) نین، هەتا هەقیان بێت رێ بەخەڵکی تر نەدەن چونکە هەر خۆ پارێزانن هەقی خاوەنێتیان هەیە بەڵام زۆربەیان نازانن ، بۆیە سادەو نەزانەکانی قورەیشیش ئەیانوت: ئێمە خاوەن و سەرپەرشتی ماڵی خواین !! بە ئارەزووی خۆمان، کێ مۆڵەت بدەین بۆ زیارەتی کابە، کێش بگێڕینەوە !. (ئیبن عەباس) ئەڵێ: قورەیش بە رووت و قووتیی و چەپڵەو فیکەو هەراو هۆسە بەدەوری کابەدا دەسووڕانەوەو تەوافیان دەکرد! جاخوای گەورەش بەوئایەتە ئەونوێژەیانی پووچەڵکردەوەو فەرمووی:

وَمَا كَانَ صَلاَتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاء وَتَصْدِيَةً فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴿35﴾

نوێژو پاڕانەوەو لاڵەشیان لەلای (کابە)دا لەرووی راستی و گوێ رایەڵییەوە نییە، بەڵکو هەرفیکەو چەپڵەو هەراو هۆسەیە سا

لەبەر بێ باوەڕییتان ئەوسزای گرتن و کوشتنە لەبەدردا بچێژن ( المکاء: الصفیر، والتصدیة: التصفیق ).

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴿**36**﴾

خوانەناسان ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆ بەستنی ڕێبازی خوا: (ئیبن جەریری تەبەریی) دەڵێت: ئەو دەمە کە قوڕەیش لە (بەدر)دا شکان وتیان: خزمینە ! خۆبینیتان (موحەممەد) چی پێکردین ؟! دەسا ئەمڕۆ ڕۆژی هیممەت و غیرەتە.. رۆژی هاوکاری و کۆمەکە، بەڵکو تۆڵەی کوژراوەکانمان بکەینەوە. ئیتر ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ڕێگرتن لە ڕێبازی خواجا بەتەئکید بەردەوام بەختی دەکەن بۆ ئەو مەبەستە پاشان دەبێتە مایەی ئێش و داخ بۆیان و، پەشیمان ئەبنەوە سامانەکەیان بەخت دەکەن ، بەڵام بۆ دوایی هەر ژێر ئەکەون و تێ دەشکێن دڵنیابن گشت بێباوەڕان بەرەو دۆزەخ ئەبرێن وکۆ دەکرێنەوە

لِيَمِيزَ اللّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىَ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعاً فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴿**37**﴾

بۆ ئەوە خوای کاردروست پیس و پاك لێك هەڵاوێرێ ، موسڵمان و کافر لێك جیابکاتەوە و مرۆڤی پیس و ناپاك ، خوانەناس و بێ دین لەسەر یەك هەڵچنێ جا گشتیان پێکەوە لەدۆزەخدا خڕبکاتەوە بێ بەخت و زەرەرمەندی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن

قُل لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينِ﴿38﴾

بەبێ باوەڕەکانیان بڵێ: ئێستاش ئەگەر دەست لە بێ دینیی و جەنگ هەڵبگرن و موسڵمان ببن، لە هەرچی ڕابوردویانە چاو پۆشیدەکرێ (لەدەورەی کوفرو خوانەناسییدا هەرشتێکیان کردبێ عەفوە) خۆ ئەگەر جارێکی تر تێبچنەوە بۆ سەنگەرو کوشتار، دیارە کەبەسەرهاتی پێشووەکان تێپەڕیوە چۆن بووە بۆ وێرانکردنی وڵات و لەناوبردنی ماڵ و سامانیان، واتە: ئەوان چیان بە سەر هات، بەسەر ئەمانەیش دێت

وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلّه فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴿39﴾

هەتا کوفرو شیرك لەبندێ و، بە هەتا هەتایی کۆتایی دێ و، دینداریی هەر بۆ خوا دەبێ، ئێوەش ئەی موسڵمانان! بەردەوام بەجەنگ بێن لەگەڵیان جا ئەگەر لەکاری خراپ و دزێوو شیرك و کوفر دەسبەردار بوون ئەوسا هەرچی بکەن خوا پێی بینایە

وَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَوْلاَكُمْ نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴿40﴾

خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، چاك بزانن کە خوا بۆخۆی (مەولا)و پشتیوانتانە خوایش چ گەورەو مەولایەکی چاکە،چ پشتیوان وکۆمەککارێکی باشە!.

لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی خوا دەکەم، کەیارمەتیدام بۆ
تەواوکردنی جزمی نۆیەم ، لە سوورەتی ئەنفال.
کۆتایی جزمی نۆیەم
ولله الحمد والمنه

وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴿41﴾

بەشکردنی (غەنیمەت و فەیئ):* لەسەرەتای سوورەتەکەدا فەرمووی :( **يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ**..) لەبارەی دەسکەوتەکەی (بەدر)ەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ چۆن دابەش دەکرێ و بۆکێ دەبێت؟ جابۆ وەڵامی ئەوپرسیارە خوای لەکارزان فەرمووی: دەبێ بزانن ئەی بڕواداران! کە هەر جۆرە دەستکەوت و غەنیمەتێکتان دەسکەوت لەماڵ و سامانی بێ باوەڕان، زۆر بێ، یان کەم دە بێ یەك لە پێنجی بۆخواو بۆپەیامبەرو خزمانیی و، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران بێت، واتە: دەستکەوتی جەنگی ئەکرێ بە پێنج بە شەوە: بەشێکی بۆ ئەوانەیەو، چوار بەشەکەی تریشی بەم شێوەیە بەسەر جەنگاوەرەکاندا بەشدەکرێت: بەشی یەکەمی بۆ خواو بۆ پەیامبەر دادەنرێت، واتە: ئەم بەشە دەدرێ بەوانە کە لە ڕێگای خوادا تێدەکۆشن و، لە سنوورەکانی وڵاتی ئیسلامییدا ئەمێننەوەو، خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ جیهادو، چاودێری وڵات و نیشتمان دەکەن و، لە کافران دەیپارێزن، هەروا بۆ هەرشتێکی تر کە بەرژەوەندیی و، خزمەتی ئیسلامی تێدا بێت سەرف دەکرێت. دیاریکردنی ئەندازەی بەشەکانی تریش حەواڵەی خەلیفەو ئەمیری ئەوکاتە دەکرێ، ئەو چۆنی بەلاوە باشبوو، وا دابەشی دەکات ئەگەر باوەڕتان بە خواو بەوبەرنامەیە هەیە ناردوومانە بۆ عەبدو بەندەی خۆمان موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست دا، واتە: لە ڕۆژەکەی بەدردا ڕۆژی بە یەکگەیشتنی هەردوو دەستەکە، دەستەی بڕواداران و، دەستەی بێ دین و

بێباوەڕان خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ویستی لە هەرشتێك بوو بیکا، دەیکات ، لەو رۆژەدا ویستی موسڵمانەکان سەرخات " ئەگەر چی ژمارەو چەکیشیان کەم بوو" سەریخستن، موسڵمانەکان (٣١٣) کەسبوون، کافرەکانیش نزیکەی (١٠٠٠) کەسبوون، بەفەرمانی خوا توانییان (٧٠) کەسیان لێبکوژن و، (٧٠)شیان لێدیل بکەن.

**ڕوونکردنەوەیەك**: هەرشتێ بەشەڕو جەنگ دەستبکەوێت، پێی دەڵێن (غەنیمەت)، هەرچیش بێ جەنگ و هەرا دەسکەوت وەکو "ماڵی سەرانەو، خەراج و، ماڵی بێ میراتگرو هەروەها.." پێیدەڵێن: (فەیئ) ئەگەرچی هەندێ لە زاناکان دەڵێن: هەردوو وەك یەکن. (ئیبن تەیمییە) دەڵێ: ئەمانە هەردوو دەدرێنە دەستی ئەمیرو پێشەوا، چۆنی بەچاکزانی، وا بەشی دەکا، تەنانەتی "جیا لەبەشی خۆی" شتێکی بۆ هەڵدەبژێردرێ، وەکو لەرۆژی (بەدر)دا شیری (زولفەقار) درایە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم).

إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتَّمْ لاَخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ وَلَكِن لِّيَقْضِيَ اللّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴿42﴾

**خوا موسڵمانەکانی لەبەدردا سەرخست**: ئەو رۆژەتان وەبیربێت ئەی بڕوادارەکان! کە لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا بە یەك گەیشتن، ئێوە لە داوێنەی نزیکتر بوون ( لە خوارووی شیوەکەدا ) و نزیك بە مەدینەوئەوانیش "بێ باوەڕەکان" لە داوێنەی دوورو، لای سەرووی مەدینەدا دامەزرا بوون کاروانەکەش لە خوارتری ئێوەوە بوو بە چوار کیلۆمەتر ونیو بەرەو دەریاو دەستیان

پێنەدەگەیی وەئە گەر ژوان و(مەوعید)تان بۆ جەنگەکە دانابا، ئەوا ئێوە لەسەر کاتەکە ناکۆك دەبوون دوادەکەوتن ، واتە: وا بەئاسانی ڕێك نەدەکەوتن و لەبەرکەمی ئێوەو، زۆری ئەوان جەنگەکەتان نەدەکرد، وەك ئێستا نەدەبوو کە کتوپڕ ڕوو بەڕوو وەستان و سەرکەوتن بەڵام بێ خۆ ئامادەکردن چوونە جەنگەکەوە، بۆئەوەی بڕیارێك لای خوا بڕاوەتەوە ( سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان و، تێشکانی دوژمنان و کافران) بێتەدی و تائەوەی دەبێ بمرێ و تیا بچێ و، ئەوەش بڕیارە بژی و زیندەبێ با هەردوولا بەبەڵگەی ئاشکرابێ، واتە: کێ موسڵمان دەبێت، با لە سەر بەڵگە موسڵمان بێت، کێش کافرو خوانەناس دەبێت، بائەویش پاش بەڵگە بێت. بێگومان خوا وتەکانتانی دەبیست کە: چۆن دەپاڕێنەوە، بە کردەوەکانیشتاندا دەزانێ شیاوی سەرخستنن، بۆیە لە بەدردا سەریخستن.

إِذْ يُرِيكَهُمُ اللّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ وَلَكِنَّ اللّهَ سَلَّمَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴿**43**﴾

**خواکافرو موسڵمانی بەکەم ئامار هێنایە بەرچاو یەك:** ئەوەش وەبیر بێنە کە: خوا لە خەونتدا ژمارەی دوژمنانتی بەکەم و بێ بایەخ نیشاندایت، هەتا هاوەڵانتی لێ ئاگادار بکەیت و، ئەوانیش دڵقایم ببن بەیارمەتی خوا. (موجاهید) ئەڵێ: خوای گەورە ئەوانی لەخەودا بەکەم نیشانی پەیامبەردا (صلی الله علیە وسلم)، جائەویش بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، دەرەنجام بەسەرکەوتن دڵنیابوون و سەریش کەوتن ئە گەر ئەوانی بەزۆر نیشاندابایت لێیان ئەترسان و سست دەبوون و لەناو خۆتانیشدا ناکۆك و پەرت دەبوون بەڵام خوا لەوە پاراستنیی و، نەیهێشت

تووشی ئەوە ببن چونکە بێگومانە بەوەی لەدڵ و دەروونداییە زاناو بەئاگایە

وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولاً وَإِلَى اللّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴿44﴾

ئەی لەبیرتانە کە: لەکاتی بەیەکگەیشتندا لەگۆڕەپانی جەنگدا بەکەم نیشانیدان لەبەر چاوتاندا، هەتا لێیان سڵ نەکەنەوەو بەدڵنیاییەوە بۆیان بچنە پێشێ و ئێوەشی لەبەرچاوی ئەواندا بەکەم نیشاندا هەتا ئەوی بڕیاری لە سەرداوە جێبەجێی کا، وەك سەرخستنی موسڵمانان کارەکانیش هەموو هەر بۆلای خوای دانا دەبرێنەوە.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلَحُونَ﴿45﴾

**هێندێ نەخشەو پلانی جەنگ:**ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ لەگەڵ دەستەیەك لە دوژمنان بەیەك دەگەن لەجەنگدا بەرامبەریان مەحکەم و دامەرزاوبن و هەرگیز هەڵ نەیەن وە یادی خوا زۆر بکەن بەشکو سەرفرازبن و سەرکەون

وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴿46﴾

وەگوێ ڕایەڵیی لە فەرمانەکانی خواو پەیامبەری ئەو بکەن وقڕە قڕو کێشەش لەگەڵ یەکتردا مەکەن، هەتا هێزو تواناتان بچێ و، ئەوساش کزو لاوازو سست ببن ئارامتان بێت- کاتێ بەدوژمن گەیشتن -چونکە دڵنیابن خوا لەگەڵ ئارامگراندایە.

وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِم بَطَرًا وَرِئَاء النَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَاللّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴿47﴾

**کەش و فشی قورەیش ئەودەمە چوونە بەدر:** ئێوە وەکو ئەوانە مەبن کە لەبەر ڕووپامایی بۆخەڵك لەماڵەوە دەرچوون و، فشەو کەشخەیان دەکرد، مەبەست لەو یاخیانە کافرەکانی قوڕیشە، چونکە ئەودەمە کە دەرچوون بۆ بەدر (ئەبوجەهل) وتی: سوێند بە خوا هەتا نەچینە (بەدر)و عەرەقی تیانەخۆینەوەو، وشتر سەرنەبڕین و، کیژۆڵەو کەنیزە گۆرانیمان بۆ نەڵێن و، هەموو عەرەب پێ نەزانن- هەتا لێمان بترسن- ناگەڕێینەوە! وریێی خوایش لەخەڵك دەبەستن و خۆ خواش بە هەموو کارێکی ئەوان زاناو ئاگایەو، گەمارۆیداون، ئیتر چی دەکەن وچی دەڵێن بۆخۆیان ئازادن

وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَاءتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ إِنِّيَ أَخَافُ اللّهَ وَاللّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴿48﴾

شەیتان ئاکاری ناپەسەندی ئەوکاتەی ئەوانی لاجوانکردن، هەتا بچن لەگەڵ پەیامبەردا(صلی الله علیه وسلم) بجەنگێن و فریویدان و پێیگوتن: ئەمڕۆ کەسێك نیە لەناو خەڵکدا بتوانێ بەسەر ئێوەدا زاڵ ببێ و منیش بۆخۆم هاوکارو پشتیوانتانم جاکە هەردوو کۆمەڵەکە یەکتریان دیت و ڕوو بە ڕوو بوونەوەو، ڕۆژی خۆی هات شەیتان پاشەو پاش دزەی بۆکردو هەڵهات وتی: بێ سۆ من لەگەڵ ئێوە نیم و بەرییم لێتان چونکە ئەوی من دەیبینم و دەیزانم ، ئێوە نایزانن و نایبینن، من دەبینم بەئاشکرا فریشتە دێنە خوارێ و هاوکاری ئەولا دەکەن چاك بزانن من لە

سزای خوا دەترسم و لەگەڵ ئێوە نیم سزاو تۆڵەی خواش زۆر سەختە بۆ تاوانباران

إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَؤُلاء دِينُهُمْ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ فَإِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴿49﴾

وەبیر بێنە کە دوو ڕووەکان و ئەوانەی لە دڵیاندا نەخۆشیی و بەدگومانی هەبوو دەیانگوت: ئەوانە- واتە: موسڵمانەکان بەقسەی ئەوان- بە ئایینەکەیان خەڵەتاون و چەواشە بوون، بۆیە خۆیان ناوە بەم جەنگەوە! ئەگینە بەو ژمارە کەمەوە چۆن جەنگ دەکرێت؟ خواش فەرمووی: با ئەوانە هەر قسە بکەن، چونکە هەرکەسێك پشت بەخوای گەورە ببەستێ، خوا یارمەتی دەدات چونکە بێگومانە کەئەو خوایە زۆر دەستەڵاتدارو بەتوانایە، کاردروست و کارجوانە، هەموو شتێکی پڕ لەحیکمەتە

وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُواْ الْمَلآئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴿50﴾

ئەر لە سەرە مەرگدا بێ باوەڕان ببینی کە: چۆن فریشتەکان گیانیان ئەکێشن، ئەوا شتێکی سەر سوڕهێنەر ئەبینی دەبینی لەو حاڵەتەدا دەم و چاوو پشتیان دەکوتن و پێشیان دەڵێن: دەسا سزای سووتێنەری دۆزەخ بچێژن

ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللّهَ لَيْسَ بِظَلاَّمٍ لِّلْعَبِيدِ﴿51﴾

ئەو سزاو لێدانەش لەبەر ئەوکارە خراپانەیە لە پێشەوە دەتانکرد و بێگومانیشبن هەرگیز خوا غەدر لە بەندەکانی خۆی ناکاو، بە ناهەق و ناڕەوا سزای هیچ کەسێك نادات

كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ فَأَخَذَهُمُ اللّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ اللّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴿52﴾

شێوەی تاوانکاریی ئەمانەیش دەڵێیت بەدکاری فیرعەون و نزیکەکانی فیرعەونە و ئەوانەش کە لە پێشیانەوە بوون، وەکو گەلی نوح و هودو.. هتد حاشایان لە ئایەتەکانی خواکرد خوایش بە هۆی گوناح و تاوانەکانیانەوە قاری لێگرتن ئاشکرایشە کەخوا زۆر بەهێزە، تۆڵەی زۆر سەختە

ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴿53﴾

ئەو سزایەش لەبەر ئەوە تووشیان بوو، چونکە: خوای گەورە هەر بەهرەو بەخششێکی بەهەر گەلێك دابێ، لێی نەگۆڕیوەو، لێی تێك نەداوە هەتا ئەوان بیری خۆیانیان نەگۆڕیبێ، واتە: مەگەر ئەوحەلە بێ بڕواو سپڵە دەرچووبن، ئەوسا ئەویش قاری لێگرتوون، خوای میهرەبان پێغەمبەری بۆناردن باوەڕیان پێنەکرد، ئەویش جەزرەبەیدان بەڕاستی خوا زۆر بیسەرو، زۆر زانایە، دەزانێ چی دەکەن و چی دەڵێن، پاشان بەپێی ئەوە سزاو تۆڵە دەدا

كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُواْ بآيَاتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَونَ وَكُلٌّ كَانُواْ ظَالِمِينَ﴿54﴾

ئەوانە بەدەردی داروودەستەکەی فیرعەون و، ئەوانەی لە پێشیانەوە بوون ( هوود و لوط ..) چوون چونکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان نەکردئینجا ئێمەیش بە هۆی گوناهەکانیانەوە لەناومان بردن هەرچی سەربە فیرعەونیش

بوون لەدەریادا خنکانمانن و نقوممان کردن کە هەموویان ستەمکار بوون و باوەڕیان بەیەکخواپەرستیی نەبوو

إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴿55﴾

بێگومان خراپترین رەوکەرو جوڵندە بەلای خواوەئەوانەن بێ باوەڕن و، باوەڕ ناهێنن

الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ﴿56﴾

ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستن پاشان جار لەدوای جار پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوە و هەرگیز لەشەڕو ئاژاوەش خۆ لانادەن، مەبەست لەو پەیمان شکێنانە جوولەکەی (بەنی قورەیزە)یە، چونکە ئەوانبوون کە پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) پەیمانی لەگەڵ بەستن بۆ ئەوە هاوکاریی موشریکەکان نەکەن ، کەچی پەیمانەکەیان شکاندو لەڕۆژی بەدردا هاوکاری وهاوبەشیی قورەیشیان کرد ! پاشان وتیان پەیمانەکەمان لە بیرچووە، بەڵام وانەبوو، چونکە چەندجارێك پەیمانیانداو هەرئاوا شکاندیان !!.

فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴿57﴾

**کافران تەمێ بکەن:** ئینجا ئەگەر لە جەنگدا زاڵبوویت بەسەریاندا وایان لێ بکە بائەوانەی لە پشتیانەوەن پەرت و بڵاوببن و پەندو عیبرەت وەرگرن بەشکو بیر بکەنەوەو دەست لە خیانەت هەڵگرن، واتە: بەڵکو ئەوانە ببنە پەند بۆ خەڵکانی تریش، تا جارێکی تر نە ئەوان و نە خەڵکانی تر، بیر لە جەنگ وئاژاوە نەکەنەوە لەگەڵتان.

وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاء إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ﴿**58**﴾

**سوێن و پەیمانیان بە ئاشكرا بدە دواوە** : گەر ترست لە هەر هۆزێ ( وەكو بەنی نەزیرو، بەنی قورەیزە) هەبوو: گزییت لێ بكەن و پەیمان بشكێنن جا تۆیش بە ئاشكرا سوێندو پەیمانەكەیان بەسەرا بدەوە، تا بەرامبەر یەك دەبن، واتە: با هەردوولا بزانن كە ئیتر پەیمان لە نێواندا نەماوەو هەوڵی حاڵەتێكی تر بدەن بە ڕاستی خوا گزیكارانی خۆشناوێت، ئەوانەی ماناو ڕێزی پەیمان نازانن و، فێڵ لەیەكدی دەكەن. پێشەوا (ئەحمەد/ خوا لێی رازی بێت) دەڵێ: لەنێوان (ڕۆم)ەكان و (موعاوییە)دا پەیمانێك مۆر كرابوو و، لەلای ئەوانەوە بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو، بۆیە (موعاوییە) ویستی لەناوچەكەیاندا بمێنێتەوە هەتا ماوەی پەیمانەكەی كۆتایی دێ و، بەخۆیان نەزانن پەلاماریان بدا ! ( عەمری كوری عەبەسە )ی پێگەیشت و گوتی: ( الله أكبر، الله أكبر )! چۆن وادەبێ، مەگەر تۆ پەیمانت لە گەڵیاندا نیە ؟واتە: دەبێ ماوەی ئەوپەیمانەت تەواوبكەیت، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: هەركەسێك پەیمانێكی هەبێ، نابێ دەسكاری بكا هەتا ماوەكەی تەواو دەبێ، یان ئاگادار دەكرێ، پاشان (موعاوییە) ناوچەكەی بەجێهێشت.

وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُواْ إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ﴿**59**﴾

بائەو بێ باوەڕانە - كەلە(بەدر) دەرچوون و نەكوژران - وابیر نەكەنەوە كە: ئیتر لەمردن رزگاربوون بێگومانبن لەدەست دەرنەچوون و، هەرگیزیش ئێمە دەستەوسان ناكەن و، جارێكی تریش هەر دەشكێنرێن.

وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴿60﴾

ئێوەش باش خۆتان ئامادەی جەنگ بكەن: هەتا بۆتان دەكرێ و لە تواناو وزەتاندایە چەك و جبەخانەی جەنگ و، ئەسپی چابوكی سواریی- دژی دوژمنانی دینی خوا - ئامادە بكەن ئەی باوەڕداران !- واتە: بەپێی ئەوكات و سەردەمە تێیدان چەك و فڕۆكەو تانك و ڕۆكێت و هەمو جۆرە پێویستیەك ڕێك بخەن دوژمنی خواو، دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن ،چونكە ئەر بزانن توانای جەنگتان هەیە ناتوانن شەڕتان پێبفرۆشن بێ لەوانیش ئەو دوژمنانەش بترسێنن ئێوە نایانناسن هەر خوا چاك ئەیانناسێ هەرشتێكیش لەڕێگەی خوادا ببەخشن بەكاملّی خوا دەیبژێرێ بۆتان و پاداشتی وەردەگرن و بە هیچ شێوەیەكیش ستەمتان لێ ناكرێ. پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) لەسەر میمبەرەكەی خۆیەوە فەرمووی: (( وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة، ألا إن القوة الرمى، ألا إن القوة الرمى))، واتە: خەڵكینە! چاك بزانن ئەو(هێزە) خوای گەورە لەئایەتەكەدا داوا لە موسڵمانان دەكا ئامادەی بكەن تیر هاویشتنە، دەسا ئێوەش خۆ ئامادە بكەن. پێشەوا موسلیم.

وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴿61﴾

ئە گەر ئاگر بەسیان ڕاگەیان، تۆش قەبووڵی بكە: ئەگەر دوژمنانی دینی خوا مەیلی ئاشتەوایی و ئاگربەسیان كردو ملیان ڕاكێشا بۆی، تۆیش ئەی پێغەمبەر ! دەتوانی قبوڵی بكەیت و، وەڵامیان بدەیتەوە، بەمەرجێ بەرژەوەندیی و، سەروەریی و

سەربەرزیی موسڵمانانی تێدا بپارێزرێ ، ئەگینا هەموو جۆرە ئاشتیی و سازشێك حەرام و یاساغە، خوا لەجێگایەکی تردا لەو بارەیەوە ئەفەرموێ:( **فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ)** ٣٥/٤٠.
( قەتادە) ئەڵێ: ئەم فەرمانی ئاگربەس و ئاشتیە، پێشی فەرمان بە جیهادو، پێش ئایەتی: **(قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ)**٢٩/٩بووە، واتە ئەو ئاگر بەسە (نەسخ) بۆتەوەو، هەردەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێت و هەر بەخوایش پشت ببەستە چونکە تەنها خۆیەتی بیسەروزانا، ئاگادار بەهەموو شتێك ، پەیمانەکەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەحودەیبیەدا لەسەر بەرچاوگرتنی ئەم بنەماو خاڵانەبوو بۆ ئاییندەی موسڵمانان , بۆیە ئاگربەستەکەی بۆ ماوەی (٩) ساڵ قەبووڵکرد

وَإِن يُرِيدُواْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللّهُ هُوَ الَّذِيَ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴿**62**﴾

وە ئەگەر و یستیان بەو ئاگربەس و سازشە فێڵت لێ بکەن جا بێگومان تۆ تەنها خوات بەسە هەر ئەو خوایەش بوو کە لەڕۆژی بەدرا بە کۆمەکی خۆیی و، بە دڵسۆزی باوەڕداران پشتیوانی کردیت

وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴿**63**﴾

وە هۆگریی و تەبایی خستە دڵ و دەرونیانەوە، مەبەست لە موسڵمانانی هۆزی (ئەوس) و (خەزرەج)ە، ئەوانبوون پاش ئەو هەموو کێشەو دوژمنایەتییە مێژووییەی سەردەمی نەفامییان- بەفەزڵی ئیسلام- ئاشتبوونەوەو بوونە برا ئەگەر هەرچی لەم زەوییەدایە بەختت کردبا لەپێناوی ئەو ئاشتەواییەدا نەدەتوانی

دۆستی وتەبایی ئاوا لەدڵیاندا جێگیر بکەیت لە نێوان دڵەکانیاندا بەڵام خوای دلۆڤان - بە میهرەبانیی و توانایی خۆی - ئاشتیکردنەوەو هۆگری خستە نێوانیان بێگومان ئەوخۆی دەسەڵاتداری لەکارزان و کارجوانە، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەلێ جار ئەو نیعمەتەی برایەتیەی وەبیر دەهێنانەوە، بەتایبەتی لە (حونەین)دا فەرمووی: مەگەر ئێوە رێتان ون نەکردبوو، خوا بەهۆی منەوە رێگەی نیشاندان، هەژارو دەست کورت نەبوون، بەبۆنەی منەوە خوا ژیاندنیەوە، پەرت و سەرلێشێواو نەبوون، خوا هۆگری خستە نێوانتانەوە، هەموو جار دەیانگوت): بەڵێ ، وە سوپاسی خواو پێغەمبەریان دەکەرد، منەتیان هەڵدەگرت (متفق علیه).

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴿64﴾

ئەی پەیامبەر! تۆ هەر خوات بەسە بۆ چاودێریی و پاراستنت بۆ ئەو بڕوادارانەش پەیڕەویت لێ ئەکەن هەر خوا بەسە .

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ يَغْلِبُواْ أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُونَ﴿65﴾

**هانی موسڵمانان بدە بچنە جەنگ:** ئەی پەیامبەر ! (صلی الله علیه وسلم) هانی باوەڕدارەکان بدە بابچنە جەنگ، لەگەڵ پێش چاوگرتنی گشت هۆکارەکانی جەنگ بە پێی توانا بۆ سەرکەوتن ئەگەر ئێوە بیست کەسی خۆ ڕاگرتان هەبێ لەم قۆناغەدا دەشێ بەسەر دووسەد کەسدا زاڵ بن (یەك بەدە) واتە: دەکرێ یەك کەستان بەرامبەری دەکەس ڕاوەستێت هەروا ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگرتان هەبێ، ئەوا بەئیزنی خوا زاڵدەبن بەسەر هەزار

کەسی کافردا چونکە ئەوانە خەڵکانێکی تێ نەگەیشتوون . بەڵێ.. وەك (ئیبن عەباس) ئەڵێ: لە سەرەتای هاتنی دینی ئیسلامەوە دەبوو یەك کەس بەرامبەر دەکەس ڕاوەستابا، چونکە موسڵمانەکان کەم و لاوازو بێ دەسەڵات بوون، دیارە بڕیاری وا لەسەر شانیان قورس و سەختبوو، بۆیە نەسخ بوویەوەو فەرمووی:

الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُواْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴿**66**﴾

هەر ئێستا خواکاری بۆ ئاسان کردن و زانی کەوزەو دەسەڵاتتان کەمەو، کز و لاوازن جا ئەگەر سەد کەسی خۆراگرو بە ئارامتان هەبێ دەرەقەتی دووسەد کەسیان دێن خۆ ئەگەر یەك هەزار کەسی خۆ ڕاگرتان هەبێ ئەوا بەفەرمان و بڕیاری خوا دەرەقەتی دوو هەزار کەسیان دێن، بۆ دواییش وا بڕیار درا کە: ئەگەر ژمارەی موسڵمانان نیوەی ژمارەی خوا نەناسان بوو، دەبێ بەرامبەریان بجەنگێن و خۆڕاگربن، خۆ ئەگەر وا نەبوو ،دەتوانن لەو شەڕە خۆ لابدەن خوایش لەگەڵ خۆڕاگرانە.

مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴿**67**﴾

**نابێ بەر لەدەسەڵات دیل رابگیردرێ:** ئیمامی(مسلیم) ئەڵێ: (عومەری کوڕی خەتتاب/ خوا لێی رازی بێ ) ووتی: کاتێ کە لەبەدرا قوڕەیش حەفتایان لێکوژراو، حەفتاشیان لێ دیلکرا، پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) لە بارەی دیلەکانەوە پرس و ڕاوێژی بەهاوەڵان کرد: ئایا چی بکرێ باشە! (ئەبو بەکر/ خوا

لێی رازی بێ ) وتی: من پێم چاکە فیدیەو بریتیان لێ وەربگیردرێ، تا خۆمانی پێ بەهێز بکەین، لەولایشەوە بەڵکو لە ئایندەدا خوا ڕێنمایان بکاو موسڵمان ببن, پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب ! تۆ ڕات چییە ؟ (عومەر)یش وتی: من وام پێ چاکە فلانی خزمم بدەیتە دەست با بیکوژم، (عەقیل)ی ئامۆزایشت بدە دەستی (عەلی)با بیکوژێ، فلانە کەسیش بدە دەستی (حەمزە) با بیکوژێ، تا هەموو کەسێ بزانێ کە: ئێمە لەگەڵ کافراندا نەرم ونیان نین، بەتایبەتی ئەوانەیان سەرۆك و پێشەوای کوفرن، پەیامبەریش (صلی اللە علیە وسلم) راو بۆچوونەکەی (ئەبووبەکر)ی قەبووڵ کرد ! (عومەر) گوتی: جا بۆ سبەینێ چووم دیتم وا پەیامبەرو ئەبوبەکر-هەردوو-خەفەتبارن و ئەگرین، منیش وتم: پێم بڵێن چی قەوماوە ؟! فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم کەهاوەڵان فیدیەو بریتیان هەڵبژارد، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: بە هیچ پەیامبەرێك رێ نەدراوە کە دیلی هەبێ و، دیل ڕاگرێ ، یان بریتی وەرگرێ هەتا هێزو دەسەلات بەدەست دەگرێت ئێوە دەتانەوێ لەززەت و کالای دونیاتان دەسکەوێ لەوەرگرتنی بریتیدا خوایش پاشە ڕۆژی ئەوێ بۆتان، ئەیەوێ پاداشی گەورەو مەزنتان دەستکەوێ و، پاشە ڕۆژ هەڵبژێرن.

**تێبینیەك:** ئەم گلەیی وعیتابە روو لەوکەسانە دەکات پێغەمبەر راوێژی پێکردن وئەوانیش فیدیەیان هەڵبژاردخوا بۆخۆی زۆر بەدەسەلات وزۆریش کارجوانە

لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴿68﴾

ئه گەر پێشتر لەخواوە بڕیاردەر نەچووبا كەسزای هەڵەكار - بە ئیجتیهاد- نەدات لە وبریتی وەرگرەتنەتاندا سزایەكی گەورەتان دووچار دەبوو وقاری لێدەگرتن

فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلاَلاً طَيِّبًا وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴿69﴾

دەسا لەو دەسكەوتە گرتووتانە بخۆن بە حەڵاڵی وپاكی وە لەخوا بترسن بەڕاستی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆر دلۆڤان و میهرەبانە، لەهەڵەی نەزان دەبووری، كوَڕی زانایان دەڵێن: پێشەوای موسڵمانان خۆی سەر پشكە -سەبارەت بەدیل- ئاخۆ دەیانكوژێ، وەكو یەخسیرەكانی (بەنی قورەیزە) یان فیدیەو بریتیی وەردەگرێ وەكو دیلەكانی (بەدر) وەیان دیل بەدیل بكا

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم مِّنَ الأَسْرَى إِن يَعْلَمِ اللّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّا أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴿70﴾

ئەی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدیلەكانی ژێر دەستت بڵێ: ئەگەر خوا بزانێ چاكەیەك لەدڵتانایە، بڕوایەكی پاك وچاك دەبێ بەدینی ئیسلام لەوەی لێتان وەرگیراوە باشترتان دەداتێ و گوناهە پێشووەكانیشتان دەبووری. پێشەوا (موسلیم)دەڵێ: ئەو دەمە كە لە(بەحرەین)ـەوە ماڵ و سامانێك دەسكەوت و هات، (عەباس )ی مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە پێغەمبەری گوت: خۆت دەزانی كە: من هەم فیدیەی خۆم و، هەم هی (عەقیل)یشم داوە، ئێستا هەقە لەو ماڵەیە قەرەبووی بكەیتەوە بۆم، ئەوجا ئەویش پارچە قوماشێكی راخست و چەندەی حەز لێبوو بردی و خواش زۆر چاوپۆشە

لەهەڵەوتاوان ، زۆریش دلۆڤانە. ئەوکاتە کەپەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) فیدیەکەی لێوەرگرتن زۆر بەقورسیان زانی، جابۆ وەڵامی ئەوە ئەوئایەتەی سەرەوە هات و، تێیگەیاندن کە: بە قازانجیان تەواودەبێ

وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ اللّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴿71﴾

خۆ ئەگەر- دیلەکان- دەیانوسیت - بەئیسلام بوونەکەیان فرت و فێڵ و خیانەتت لەگەڵ بکەن و، لەدڵەوە بەڕاستیان نەبوو بەراستی پێش دیل کردنیشیان لەگەڵ خوا خیانەتیان کردو ناراست بوون ئەوسا خوایش ئێوەی زاڵکرد بەسەریاندا و تیێشکاندن، جا ئێستاش ئەگەر شتی وا بکەنەوە ئێمەش وایان لێدەکەینەوە خوا زانایە، لەکارزان و کارجوانە، ئەزانێ چی باشە بۆ مەردوم.

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ أُوْلَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلاَيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُواْ وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلاَّ عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴿72﴾

**موهاجرو ئەنسار بوونە یەکدەستە:** ئەم سورەتی(ئەنفال)ـە بە باسێکی (موالات) کۆتایی دێت ، هەتا هەموو کەسێك دۆست و پشتیوان و (وەلیی) خۆی بناسێ و لێی لانەدا، بۆیە دەفەرموێ : بێ سۆ ئەوانەی باوەڕیان هێنا و لەزێدو وڵات و نیشتمانی خۆیان - لەبەر خۆشەویستی خواو پەیامبەرەکەی- کۆچیانکردو لەڕای خوادا - بەسامان و گیانیان- جیهادیان کرد و ئەوانەش کە کۆچەرەکانیان بەخۆوە گرتوو و یارمەتییاندان ئەمانە گشت

دەبنە خزم و کەس و کاری یەکتر و میراتیش لە یەکتر دەبەن ئەوانەش کە باوەڕیان هێنا و هەر لە مەککەشدا مانەوەو کۆچیان نەکرد" بۆ مەدینە" ئێوە هیچ هەقێکتان بەسەریانەوە نیە ، واتە: میرات لەیەك نابەن و، لەسەرتان نییە یارمەتیشیان بدەن، وە لەدەسکەوتی جەنگیش بەشنابەن هەتا ئەوانیش وەکو ئێوە لەولاتی کوفر هیجرەت دەکەن خۆ ئەگەر داوای یارمەتییان لێکردن بۆ پاراستنی ئاییینەکەیان، دەبێ ئێوەش یارمەتییان بدەن و سەریانخەن بەسەر دوژمنانی هەردوولاتاندا مەگەر دژی ئەوانە لەگەڵ ئێوە هاوپەیمانن و رێکەوتننامەیان مۆرکردبی ئەگەر چی کافریش بن، لەو دەمەدا نابێ یارمەتییان بدەن خوا بە هەموو کردەوەکانتان بیناو بەئاگایە، بەم ئایەتانە پەیوەندیی و دۆستایەتی لەنێوان ئیمانداران و خوا نەناساندا قەدەغە کرا. خوای بە بەزەیی موسڵمانەکانی کردە سێ بەشەوە: کۆچکەران، پشتیوانان ، کۆچ نەکەران. کۆچکەران پێش دەخا،چونکە ئەوانن بناغەی دینی ئیسلام، پاشانیش باسی پشتیوانان دەکات، چونکە لەو رۆژە تەنگەدا دەستی کۆچ کەرەکانیان گرت و, خوایش مافی (وەلایە)ی خستە نێوانیانەوە, ئەو موسڵمانانەش کۆچیان نەکرد هەتا کۆچ نەکەن مافی ( وەلایە)یان نیە .

وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴿**73**﴾

**خوا نەناسانیش گشت یەکتاقمن و ، نابێ بکرێنە دۆست:** ئەوانەش خوانەناس و بێ باوەڕن دۆست و هاوکاری یەکترن، کەوابوو نابێ- لەلایەن موسڵمانانەوە- یارمەتیی و هاوکاری بکرێن خۆ ئەگەر ئێوە بەوشێوە نەکەن فەرمانتان پێکراوە؛ واتە:

موسڵمانان نەکەنە دۆست و هاوکارو، خوا نەناس و کافرانتان کردە دۆست و هاوکارکارەساتێکی گەورەو فەسادو ئاژاوەیەکی سامناك لەرووی زەویی سەرهەڵدەدا، چونکە موسڵمانەکان بێ هێزو لاواز دەبن و، بێ باوەڕەکان بەهێز دەبن. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵکی دوو ئایین لێك جیاواز میرات لەیەك نابەن، هەروەکو موسڵمان لەکافرو، کافر لە موسڵمان میرات نابەن، پاشان ئایەتی: ( **والـذين كفــروا بعضــهم أوليــاء بعــض ..**)ی خوێندەوە.

وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴿74﴾

**ئیمانداری راستەقینە بناسە:** ئەوانەش بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە ڕای خوادا ئەوانەش" کۆچکەرەکانیان پەناداو یارمەتییان دان ئەمانەن باوەڕداری بەهەق لێبوردن و ڕۆزییەکی باش و قەشەنگیان هەیە

وَالَّذِينَ آمَنُواْ مِن بَعْدُ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ مَعَكُمْ فَأُوْلَئِكَ مِنكُمْ وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴿75﴾

ئەوانەش دواتر باوەڕیان هێنا و هیجرەتیان کردو لە گەڵ ئێوەشدا جیهادیان کرد ئەوانە لە ئێوەن، ئەگەرچی پاداشی ئێوەشیان نەبێت، کەوابوودەبێ ئەمانەیش یارمەتیی و هاوکاریی بکرێن خزم بۆ خزم – بەپێی کتێبی خوا نزیکترن – بۆ میرات لە یەکتر گرتن. ئەم ئایەتە ئەو جۆرە میرات بردنە هەڵئەوەشێنێتەوە کە بەهۆی برایەتیی و هاوپەیمانیەوە لە یەکتریان دەگرت، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر بنەماکەی خۆی کەبە

خزمایەتیە. بە ڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە، هەموو شتێك لای ئەو حیكمەتێكی تێدایە، واتە: ئەگەر میراتگری پشتیی نەبوو، خزمە نزیكەكان شایستە ترن لە بێگانەكان. سوپاسێكی بێ وێنە، بۆ خوای تاك وبێ وێنە، كە یارمەتیدام بۆ تەواو كردنی تەفسیری سوورەتی (ئەنفال). وصلی الله وسلم وبارك علی محمد وآلە وصحبە و كل من والاە.

لە كۆتایی دا تە نییا ئەوە ماوە كە بیڵێم ئایا خوێنەری بەڕێز دەكرێت كەسێك بۆ خۆی خاوەنی بیرۆكە و فكرەیەك بێت دوژمنەكەی وەسفی بكات؟ ڕوونتر بیڵێین من كە تاكێكی ئیسلامیم دەكرێت من پێناسەی دیموكراتی بكەم كە لە ئەسڵدا ئەم ووشەیە وشەیەكی یۆنانییە؟ یان دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەكەی و لەخاوەنی بیرۆكە كەوە پێناسەكەی وەرگرین كە دەڵێن لە دوو ووشە پێك هاتوە (دیمۆ + كرات) كە مانای ڕای گەل بۆ دەسەڵاتە! بێگومان هەمووكەسێكی ئاقڵ ئەوە ڕەت دەكاتەوە كەوا لە جیاتی خاوەن بیرۆكە كەسێكی تر پێناسەی بیرۆكەیەک بكات. ئەی باشە ئەوكەسەی كە دژ بە بەرنامەی ئیسلام بێت چۆن دەتوانێت پێناسەی ئیسلام بە واقیعی بۆ خەڵكی بكات؟ هەڵبەت لای كەس شاراوە نی یە كە تە نییا خەڵكی چەواشە دەكات و تە نییا تۆمە ت و پڕو پاگەندە بڵاو دەكاتەوە و تە نانەت وە ك ئەوەی كە ئێمەی مسوڵمان سەرچاوەكانییان دەخوێنینەوە ئەوان بۆ خۆشییان ئەو بێ ڕێزییەی كە دەیكەن بەرامبەر بە م سورەتە پیرۆزە سوێندتان لەسەرم نی یە نازانن ناوەڕۆكی ئەم سورەتە باسی چی دەكات ،وە كەڕو كوێرو لاڵن لە ئاستی قورئان دا، گەر تەفسیرەكەتان خوێند بێتەوە بۆتان ڕوون بۆیەوە كە ئەم سورەتە پیرۆزە كە ناوی ئەنفالە سەرەتاكەی باس لەوەدەكات كە چۆن دەسكەوت حەقی خواو پێغەمبەری خوایە كە چۆن دابەشی بكەن

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هاوەڵان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتنییان بەدەست هێنا بە پشتیوانی خوا دوای جەنگەکە بووە کێشەیان لەسەر دەسکەوتەکان ، بەهەرحاڵ تەفسیرەکە ڕوون و ئاشکرا دیارە کە باسی چی دەکات و کارەساتی بەناو ئەنفالیش دیارە کە صەددامێکی بەعسی عەلەمانی چۆن بۆ مەرامی سیاسی خۆی ئەم سورەتەی بەکار هێنا لە دژی میللەتی مسوڵمانی کووردا، وە هەندێک لەو کتێبانەی کردە بەڵگە کە تییایان دا نوسراوە (کوورد مسوڵمان نییە وە ئەو قورئانانەی کە ناردوتانە بۆ کوردستان پێمان حەیفە بە کەرێکی کووردی بۆتانی بنێرینەوە بەڵکو حوشتریکی سعودی بنێرن تاپێیانی بنێرینەوە) ئەمەو دەیان کاری دیکەی خراپەکاری ئەوکاتەی کۆمەڵەو عەلەمانیی یە خوێن ڕێژەکان کەخوێنی ئەو هەموو میلەتەیان ڕشت و ئێستاش لەسەرخوێنی ئەوان تەنییا خەریکی گیرفان پڕکردنن ،پێمان ناڵێن کێ بوو کە کەوتە پێش لەشکری حیزبی بەعسی عەلەمانی؟ مەگەر ئێستا زۆرێك لەو جاشانە هەر لەناو حیزبە عەلمانییەکان دا نین؟وە ئێستاش دەستی پیس و گڵاوتان بەسەر ئیسلام ومسوڵمانان دا دەسڕن ! مەگەر صەدام نەبوو دەیان و سەدان مزگەوتی سوتان و بڵند گۆی مزگەوتەکانی دادەگرت لە گوندو ناوچەکانی گەرمییان؟ مەگەر هەر ئەو صەدامە عەلە مانییە نەبوو کە هەرچی شتی خێر خوازی یە ناوی نابوون صەدام،وەك(مستشفی صدام و،،،هتد) وە هەرچی شتە خراپ و نامۆکانیش بوو ناوی صە حابەی پێغەمبەری خوای لێنابوون(صلی اللە علیە وسلم) وە ك کەتیبەی خالیدی کوڕی وەلید و،،،هتد) مەگەر صاروغی حسێنی نە دەگرتە ئێران! لە کاتێکدا ئەوان هەموو ساڵێك شینی حسن و حسێن دەگێڕن؟ ئەمەو چەندین ڕاستەقینەی کە کە هەمووی بەرهەمی گڵاوی دەستی ئەم کۆمۆنیست و عەلمانیانەن ئێستاش لە پاش دۆڕان و ئیفلاسی فیکرییان بە بێ ئەوەی شارەزایشییان هەبێت لەم سورەتە پیرۆزە کەتەنییا دەیانەوێت لە ڕێی سۆزو

عەطفەوە و بەسوتاندنی قینی ڕە ش و بۆگەنیان دەڕژن بەرامبەر بە ئیسلام و مسوڵمانان و سالآنە لە یادکردنەوەیدا دەیان وتەی نەشییاو بێ ئابڕوانە لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەکانییانەوە دەڵێن بەرامبەر بە مسوڵمانان تاوەکو ئەو جیلەی کە پەروەردە دەبێت لە سەر دژایەتی کردنی قورئان و بەرنامەکەی پەروەردە بێت، کەوابوو ئەی دایکان و باوکانی بەڕێزم ئەی برایان و خوشکانی خۆشەویستم ئەی گەنج و لاوە خوێن گەرمەکانی ئیسلام  وەرنەوە هۆشی خۆتان و ئاگاداری پیلانی ژەهراوی ئەم بە چکە بەعسییانە بن کە هەمان ڕێرەوی ئەو دووپات دەکەنەوە و دەیانەوێت لەو ڕێگەیەوە گەنجەکانمان بێبڕواو بێ دین بکەن.

(سبحانك اللهم وبحمدك أشهدوألاإله إلا الله أستغفروك وأتوب إليک)

بەسوود وەرگرتن لە:

بەرنامەی دەنگی قورئان و تەفسیری رامانی مامۆستاو زانای کۆچکردوو:

مامۆستا ئەحمەدی کاکەمەحموود خوای گەورە پلەی بەرز بکات لای خۆی و وە پاداشتی خێری هەموو ئەو براو خوشکانەش بداتەوە لە دامەزراندن و دابەزاندنی ئەم تەفسیرە لە بەرنامەی دەنگی قوورئان کە زۆر یارمەتی دام بۆ نوسینەوەی ئەم تەفسیرە.